# القاموس الجيبي المُيسر

# فەرهەنگی گیرفانیی ئاسان

## عربي-كردي

الطبعة السادسة




پێشکەشە بەدایك و باوکم کەهێمای رەنج و تەقەلابون لەپێناومدا

پێشکەشە بەبــرایانی ماندونەناسم مامۆستا ئارام عبدولواحدو

مامۆستا ئەنوەر عبدولفەتاح

پێشکەشــە بەهەموو هۆگـــرو دۆســـــتانـی زمـــان

پێشکەشە بەهەموو دۆست و خۆشەویستانم

بسم الله الرحمن الرحيم

## مقدمة الطبعة الثانية

العـالم اليـوم يـتغير بـين عشـية وضـحاها، وصـار كالقريـة الصغيرة المترابطة بعضها ببعض، بسبب التقـدمات والتطـورات التـى رأى العـالم بنفسـه. والمثقّـف المطلّـع بـامس الحاجـة الى سلاح الفهم والحوار إزاء كل التحديات والمعلومات التى سـرعان ما تتلاشـى وتتلـف، وحتـى لم يتخلّـف فـى زاويـة ضـيقة وبـدا يشارك بشكل فعّال وحيّ مع التطورات، فيجب ان يتسلّح نفسه لُغَة العصر والزمان.

* وما المعجم الاّ اداة بحث، ومرجع سهل المأخذ، فينبغي ان يكون واضحاً، دقيقاً، محكم التبويب. وقد اتبعنا هـذا الاسـلوب فى منهجنا.

* ولكن مهما يكن من امر، فانّا نتوقع ان يثير هذا المعجم نقداً ومعارضة وانّا لنرحب بهما معاً، والحقيقة بنت البحث.

فلا يفوتني ان اشير الى ما قال صاحب المنجد في مقدمة الطبعة السابعة عشرة: ( واغلب الظن ان عملنا لايخلو من خطأ فالى ارباب اللغة نرغب ان يتفضلوا فيلتفتوا نظرنا الى ما نكون قد لحنّا فيه). وانا اعترف كرارا ومرارا بهذه الحقيقة اين انا من هؤلاء. وعملنا لم يبرأ من نقص او خطأ والكمال لله وحده، فالى ارباب اللغة ارغب فليتفضلوا بملاحظاتهم القيمة وان يزودوني بارشادات سديدة ويد عون مديدة بما كنت قد لحنت فيه.

* وقد اهملت كثيراً من الالفاظ الوحشية الجافية، او التى هجرها الاستعمال لعدم الحاجة اليها او قلّة الفائدة فيها...

* وللبحث عن الكلمات اوردنا المفردات وفقاً لحرفها الاولى دون النظر الى جذور الكلمات، وذلك ليسر معرفتها دون الرجوع الى اصل الكلمة، فمثلاً: اوردنا كلمة(حُبّ) تحت حرف الحاء، وكلمة(مُحبّ) تحت حرف الميم...

وكذلك بالنسبة لترتيب الكلمات، اوردناها هيجائيا، حتى فى حروفها ، فمثلاً: قدّمنا كلمة(بحت) على كلمة(بحث) بسبب التسلسل الهيجائي لكلٍّ حروفها.

* اخيراً، نحن بعملنا هذا نأمل أن نكونَ قدّمنا شيئا يسرا في هذا المجال ما يفيد طلاّبنا الاعزاء من كلمات ومعانيها

والله وليّ التوفيق

✍/ اكو فاتح حمه كريم

٢٠٠٤/١/٢٠

## تنبيهات

ـــ أوردْتُ المفـــردات وفقـــاً لحروفهـــا الاولى وحســـب ترتيـــب الهجائيّة.وكذلك حروفها الثانية بنفس الترتيب والتسلسل.

ـ ماأوردْتُ الأفعال سواء كان ثلاثياً او رباعيـاً او مزيـداً فيهمـا، خشية التطويل.

ـ وقد وضعت الفارزة تفريقاً بين المرادفات، والواو مع(ـ) معنـى اخر لنفس الكلمة.

ـ يمكنكم اتصال بنا لأي ملاحظة او ايضاح، يؤخذ بنظر الاعتبار مع الشكر والتقدير، عبر الانترنيت:

asan-ako@maktoob.com او

akoasan@yahoo.com

ـ هذه الحروف رموز لتلك الكلمات:

(ن) ـــ مرض (ج) ـــ حشرة

(ر) ـــ نبات (م) ـــ فاكهة

(ئا) ـــ حيوان

بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

جێی خۆیەتی پێشەکی سوپاس و ستایشی بێپایانی پەروەردگار بکەم، کەیارمەتیدام و رێزی ئەم کارەی پێرەوا بینیم.جا ئەگەر چاوێك بەمێژوی نەتەوەکاندا بخشێنینەوە، دەبینین چۆن زمان بۆتە بەیداخی جودایی و هێمای بون و مەشخەڵی رون و بەلگەی هەبونی ئەو نەتەوانە، وە چۆن بۆتە یەکێك لەتایبەتمەندیەباڵاکانیان.

بۆیە ئەمرۆ پتر لەدوێنێ پێویستیمان بەرۆڵی زمان هەیە، تا لە کاروانی پێشکەوتن و گەشەسەندندا جێنەمێنین و، هەلکەین لەگەڵ ئەو بارودۆخەدا کەدەبێ بیگوزەرێنین و بەردێکی خزمەت بخەینە سەر کاری سبەی و، وەلە رەوڕەوەی تەوژمی زانست و زانیاری دوانەکەوین.

چونکە پتر لەجاران پێویستیمان بەیەکەوەژیان و لەیەکترحاڵیبون و هاوکاری... هەیە؛ بەهۆی ئەو پێشکەوتنە لەبەرچاوەی کە دونیای کردۆتە گوندێکی بچکۆلەو، پەردەی نەهێشتووە لەنێوان وڵاتاندا. کەوابێ بۆ تێگەیشتن لە دەوروبەر پێویستیمان بەزمانی ئەم و ئەو دەبێت. جا بۆ ئەم مەبەستە فەرهەنگ رۆڵێکی گرنگ

دەبینیٚ، وە هەروەها هۆکارێکی باشە بۆ زیندو راگرتنی سەروەری زمان. کەواتە دانانی فەرهەنگ بەو هەمو وردەکارییەوە کارێکی سادەو سانانیە، جا ئەمەش ئەرکی تاکە کەسێك نیە، چونکە دەبیٚ چەند کەسێکی لێزان و زمانەوان بەم کارەهەڵسن و، هەریەکە راوبۆچونی زانستیانەی خۆی پێشنیار بکات و، پاشان یاساو رێسایەکی راست و دروستی کۆدەنگی بۆ هەڵێنجریٚ.

هەرچۆنێك بێت ئەرکی تاکە کەس بۆ ئەم کارە لەکەموکوڕی و ناتەواوی قوتاری نابیٚ. جا بۆیە داواکارم لە خوێنەری ئازیز بەدڵێکی فراوان و لێبوردەوە بۆ هەڵەکان بڕوانیٚ و، لەپێشنیاری دروست دریٚغی نەکات، چونکە لەفەرهەنگێکی گچکەی وادا ناتوانریٚ پەل بۆ هەمو شت بهاوێژریٚ و دەمی لیٚبکوتریٚ. وێڕای هەمو ئەمانە، بەوهیوایەی توانیبێتم بەردێك لە سەر بەرد بنێم بۆ کتێبخانەی کوردی و، وەسودێکم بەگرۆهی فێرخوازان و زانست دۆستان گەیاندبێت.

ئاکۆ فاتیح

سلێمانی/٢٠٠٢

## وریایی

– وشه عەرەبییەکان بەپێی یەکەم پیت ریزکراون (هیجائی) هەروەها دوەم پیت... بەهەمان شێوەو شێوازْ هێنراون.

- لەبەر درێژەپێنەدان هیچ دەمێکی فرمانمان نەهێناوە.

- کۆمام بۆ جیاکردنەوەی هاوواتاکان هێناوەو، واو(–)یش بۆ واتایەکی تری هەمان وشە.

- بۆ هەرپێشنیارو تێبینیەك دەتوانن لەرێی ئەنتەرنێتەوە پێمان بگەیەنن، کەبەو پەڕی رێز وسوپاسەوە وەردەگیرێ:

asan-ako@maktoob.com یان

akoasan@yahoo.com یان لەرێی کتێبخانە بەرێزەکانەوە.

- ئەم پیتانە هێمای ئەو وشانەن:

(ن) ــــ نەخۆشی.

(ر) ــــ رووەك.

(ئا) ــــ ئاژەڵ.

(م) ــــ میوە.

(ج) ــــ جانەوەر.

چەند زانیارییەك سەبارەت بەم فەرهەنگە:

*ئەم فەرهەنگە هەرچەندە بەقەبارە بچووکە، بەڵام دەکرێ ئەوە بگوترێ، کە فەرهەنگێکە بە سوودە بۆ کەسی سەرەتایی لە زمانی عەرەبییدا تا دەگاتە... قۆناغی زانکۆ. کە گەلێك وشەی جۆراوجۆری لە خۆگرتووە سەبارەت بەهەموو زانستەکان.

* دۆزینەوەی وشە زۆر ئاسانو سادەیە لەم فەرهەنگەدا ، بۆنمونە ئەگەر بتەوێت بۆ وشەی (بحث) بگەڕێت، ئەوە لە پیتی (ب)دا بۆی بگەڕێ، وەپاشان سەیری پیتی دووەم بکە، دەبینیت ئەویش بەهەمان شێوە بە شێوازی (هیجائی) ڕیزکراوە، بۆیە وشەی (باحث) دەکەوێتە پیش وشەی (بحث) لە ڕوانگەی ڕیزکردنەوە، وە وشەی (بخت) دەکەوێتە دوایی وشەی (بحث). بۆیە لەریزکردنی وشەکان رەچاوی باری وشەکان کراوە لەروانگەی هەموو پیتەکانییەوە، کە هەموو پیتەکانی بەشێوازی (هیجائی)، واتە: بەشێوەی: ا،ب، ت، پ....ریزکراون.

* ئەم فەرهەنگە دەمەکانی فرمانی لەخۆنەگرتووە وەك ئاماژەمان پێداوە، کە((چاوگ)) سەرچاوەی دارشتنی

دەمەکانی فەرمانە، بۆیە ئەگەر بمانەوێت بۆ وشەیەك بگەڕێن لەدەمی رابردوودا، ئەوکات سەیری (چاوگە) کەی دەکەین لەفەرهەنگەکەدا، ئەوجا وشەکە دەخەینە سەر دۆخی رابردوو، وەماناکەشی لە مانای (چاوگە)کەیەوە وەردەگرین.

بۆنمونە وشەیەك وەردەگرین: (إستِخرَاج) کە رابردووەکەی (استَخرَج) یە، ئەمەش دەتوانین لەرێی ئەو پاشکۆیەوە دەستی بخەین کە لە کۆتایی ئەم فەرهەنگەدا باسمان کردووە، کە دەکرێت شارەزایی سەبارەت بەهەموو دەمەکانی فەرمان ببین لەگەڵ رەگو ریشەیدا.

بۆنمونە ئەگەر (چاوگێك) یان (دەمێکیفرمانمان) هەبێت، بەو کێشانەی هێناومانە دەتوانێت دۆخەکانیتریشی بزانیت، بۆنمونە کێشێك وەردەگرین:

تفاعل(رابردوو)، یتفاعل(رانەبردوو)، تفاعُل(چاوگ).

کە بەچاوگەکەی دەتوانین رابردوو رانەبردووەکەی دیاری بکەین، یاخود بە پێچەوانەوە.

## سود لەم سەرچاوانە بینراوە

🕮المنجد في اللغة/ تألیف لویس، الطبعة السابعة والثلاثون.

🕮المعجم الوسیط/ قام باخراجه جماعة من اللغویین.

🕮قاموس الطالب/ دکتور فایز محمد.

🕮مفردات الفاظ القران/ راغب الاصفهانی.

🕮فەرهەنگی خاڵ/ شێخ محمدی خاڵ.

🕮هەنبانە بۆرینە/ هەژار موکریانی.

🕮کوردستان/ گیوی موکریانی.

🕮فرهەنگی تاهیر سادق/ تاهیر سادق.

🕮باکورە/ گیوی موکریانی.

🕮ئەستێرە گەشە/ فاضل نظام الدین.

🕮فەرهەنگی شیرین/ فاضل نظام الدین.

🕮فەرهەنگی زانیاریو گەنجینەو دوڕشتەو مهابادو موختارسیحاح و گۆڤاری پەروەردەو زانستو، وەچەندان فەرهەنگو وشەدانیتر.



**أ:** یەکەم پیتی زمانیعەرەبی یە. و- ئایە، ئاخۆ؛ بۆ پرس.

**آ:** هۆ، ئەی؛ بۆ بانگ کردن لە دورەوە.

**إئتِلاف:** پێکهاتن.و- تەبایی ، کۆکی. و- هۆگربوون، رام بوون.

**إئتِمان:** متمانە، دلّنیایی.و- باوەڕپێکردن.

**إباء:** نەویستن.

**إباءَة:** بێزاری.و- مل نەدان، سەرپێچی.

**أَبابَة:** یاد؛ تەمەزرۆبوون بۆ نیشتمان.

**إباحَة:** رێدان، هێشتن.و- رەوابینین.

**إباحِيَّة:** بەرەلاّیی.و- خراپەکردن، بانگەشە بۆکردنی.

**إبادَة:** لەناوبردن، تەفروتونا کردن.

**إبالَة:** کورزە، پێچراوە.

**أبالَة:** وشترەوانی.

**أبانَة:** ئاشکراکردن.

**أبّ:** ئامەزرۆبوون.و. گژوگیا.

**إبّان:** سات، ئاف.و. سەرەتا.

**إبْتِداء:** دەست پێکردن.و.
سەرەتا.

**إبْتِدائِيّ:** سەرەتایی.

**إبْتِدال:** بەکاربردن،کۆنکردن.

**أبْتَر:** وەچاخ کوێر.و. قونە؛
گیانداریك كلكی بڕابێت.

**إبْتِراء:** دادان، داتاشین.

**إبْتِسام:** بزە، زەردەخەنە.

**إبْتِعاد:** دوورکەوتنەوە.و.
دەربەدەری.

**إبْتِغاء:** ویستن، ئارەزوکردن.

و. تەقەلاکردن.

**إبْتِلاء:** دووچاربوون.و.
تاقیکردنەوە.

**إبْتِلاع:** قوتدان، هەڵ لۆشین.

**إبْتِهاج:** دڵخۆشی، کامەرانی.

**إبْتِهال:** پاڕانەوە، لاڵانەوە.

**إبْتِیاع:** کڕین، سەندن.

**أبْخَر:** زارگەنین، دەم بۆگەن.

**أبَد:** هەمیشە، هەردەم.و.
دێرین.

**أبداً:** هەتاهەتایی.و. هەرگیز.

**إبْداء:** ئاشکراکردن،
دەرخستن.

**إبْداع:** داهێنان، نقار؛ هێنانە
کایەوەی شتێکی تازە.

**إبْدال:** گۆڕین.

**ابدان:** لێکۆڵینەوە.

**آبِدَة:** دڕندە، کێوی.و-
ترسناك.

**أبَدِيّ:** هەمیشەیی،بەردەوامی
.و- بێکۆتا.

**إبْراز:** دەرخستن، پیشاندان.

**إبْرام:** بڕینەوە،یەکلاکردنەوە
؛ بۆ پەیمانو بەڵێن.و-
بڕیارلەسەردان، بەستن.و-
قایم کردن.

**إبْرَة المَشَرة:** چزو.

**إبْرَة الخياطة:** دەرزی.

**إبْرَة النبات:** دڕك، چقڵ.

**أبْرَش:** بازگ؛ سوورو سپی
تێکەڵاو.

**أبْرَص:** بەڵەك.

**أبْرِية:** کرێوە.

**إبْرِيز:** ئاڵتونیپوخت.

**إبْرَيْسَم:** ئاورێشم، تەمووش.

**إبْرِيق الشاي:** قۆری، چاپەز.

**إبْرِيق:** مەسینە، لولێنە.

**إبْزِيم:** ئاوزونە، بەرەزاوانە.

**إبْصَار:** بینین، دیتن.و-
تێبینی کردن.

**أبْيَض:** رەفیسك؛ پشتی
کڵاوەی ئەژنۆ.و- بەستنەوە.

**إبْط:** بن باخەڵ، بن هەنگڵ.
و- دامێنی چیا.

**إبْطاء:** دواخستن.و-

خاووخليچكىكردن.

**إبْطال:** پووچكردنەوە، هەڵوەشاندنەوە.و. شتى پوچ هێنانەوە.

**إبْعاد:** رەهەندە؛ ئاوارەى ماڵبەكۆڵ.و. دوورخستنەوە.

**إبْغاء:** هێشتنەوە، گلدانەوە.

**إبْغاض:** رق لێبوون.و. بێناخۆش بوون.

**أبق:** كەتان.و. راكردوو.

**إبْقاء:** هێشتنەوە.

**أبْقار:** رەشەوڵاخ.

**إبْكاء:** گریاندن.و. نارەحەت كردن، خەفەتباركردن.

**أبْكَم:** لاڵ، بێزمان.

**إبْلاغ:** راگەیاندن، وەڵامدانەوە.

**أبْلَه:** گەوج، دەبەنگ.

**إبْليس:** شەیتان، چەتوون.

**إبْن آوى:** چەقەڵ(ئا).

**إبْن:** كوڕ.

**أُبْنَة:** تانوت، تەشەر.و. مێخەكە؛ گرێو برینێكە دروست دەبێ(ن).و. رق، كینە.

**إبْنَة:** كچ.

**إبْهام:** پەنجە گەورە.

**أُبْهَة:** شكۆیی، مەزنی.و. پیاوەتی، جوامێری.

**أبو يقظان:** كەڵەشێر(با).

**أُبو:** باوك.و. خاوەن.

**أبَوان:** باوان؛ دایكو باوك.

**أُبوّة:** باوكێتی، باوكايەتی.

**أبيَض:** سپی، چەرمگ.

**أبيَضانيّ:** سپیكار.و.
سپيايی.

**آت:** هاتوو؛ ئەوەی كەدێ.و.
داهاتوو، ئاينده.

**إتاحَة:** دەرفەتدان، ماوەدان.
و. ئامادەكردن.

**أتان:** ماكەر(ئا).

**إتاوة:** سەرانە، خاوە.

**إتْباع:** شوێن كەوتن،
بەداواداچوون.و. پەيرەوكردن

**إتّجاه:** ئاراسته.و. ئاست.و.
رێباز.و. رووكار.و. رووەو.

**إتّحاد:** يەكێتی، يەككگرتن.و.
كۆك.

**إتّخاذ:** راگرتن.

**إتّساع:** فراوانی، پانوپۆری.

**إتّساق:** ريزكردن.و.
رێكخستن.

**إتّصاف:** ناسادن؛ بەيەكێك
لە سيفەتەكانی.

**إتّصال:** بەيەك گەيشتن.و.
پەيوەندی.

**إتّفاق:** رێككەوتن، پێكهاتن.
و. گونجان.

**إتّفاقِيّة:** پەيماننامە.و.
بەلێنداری.

**إتّقاء:** دووركەوتنەوە.و.
خۆپاراستن.و. خواپەرستی.

**إتّكاء:** پاڵدانەوە،پشتدانەوە.

**إتّكال:** پشت پێبەستن.

**إتّهام:** تاوانبارکردن.و.
دانەپاڵ.و. بەگومان بوون.

**أتّون:** توون؛ کوورەی گەرماو
.و. کوورە.

**أتراب:** زۆربوون.

**إتساق:** سازش کردن، قبوڵ
کردن.

**إتقان:** شارەزایی، وردەکاری
.و. جوانکاری.

**إتلاف:** بەفیڕۆدان.و.
لەناوبردن.

**إتمام:** تەواوکردن، بەئەنجام
گەیاندن.

**إتيان:** هێنان، هاوردن.و.
ئامادەبوون.و. کردن.

**أتيّ:** بێگانە، غەریب.

**أثاث:** پیتاك، کەلوپەلو
شمەکی ناوماڵ.

**إثارة:** شۆڕش کردن.و.
وروژاندن، خرووشان.

**إثبات:** جێگیرکردن.و.
سەلماندن.

**أثر:** پاشماوە، جێماوە.و.
نیشانە، شوێنەوار.و. دێرینە،
کۆنینە.و. کارتێکردن.

**أثريّ:** شوێنەوارناس.و.

کۆنینه‌یی، دێرینه‌یی.

**أُلفِيَّة:** سێپا، سێ‌کوچکه.

**إثقال:** قورس کردن.و.

زیادکردن، زۆربوون.

**أَثل:** گەز؛ جۆرە

حەیزەرانێکە (ر).

**إثم:** تاوان، خەتا.و. خراپە،

بەدی.

**إثمار:** بەرهەم هێنان.و.

کەوتنە بەرهەم.

**إثمِد:** سوورمە، کل.

**أثناء:** لەمیانەی، لەکاتی.

**إثناعشري:** دوازدەگرێ.

**إثنان:** دوو.و. جووت.و.

دوولایەکی، دووقۆڵی.

**أثِير:** بەرێز.و. کاریگەر.و.

چەخماخەی شیر.

**أثِيم:** تاوانبار، گوناهبار.

**إجَابَة:** وەڵامدانەوە.

**أُجَاج:** سوێراو.و. تاڵاو.

**إجَار:** کرێ.

**إجَازَة:** مۆڵەتدان، هێلان.و.

بەرەوابینین.

**إجَاص:** هەڵوژە (م).

**إجْبار:** زۆرلێکردن،

ناچارکردن.

**إجْبارِيّ:** ناچاری، زۆرەملێی.

**إجْتِباء:** خڕکردنەوە،

کۆکردنەوە.

**إجْتِرار:** کاوێژکردن.

**إجْتِمَاع:** كۆبوونەوە.و. كۆكردنەوە.

**إجْتِماعِيّ:** كۆمەڵایەتی.

**إجْتِناب:** دوورکەوتنەوە، تەکینەوە.و. خۆپاراستن.

**إجْتِهاد:** کۆشش کردن، تەقەلاکردن.

**إجْتِياح:** رامالّین.و. لەناوبردن .و. لەبن و بێخ دەرهێنان.

**إجْتِياز:** رەت بوون، تێپەڕین .و. گوزەراندن.

**إجَّانَة:** تەشت؛ دەفرێکە بۆ شت تیاشۆرین.

**أجْدَاد:** باووباپیر، باپیران.

**أجْر:** پاداشت.و. کرێ، مزە.

**آجُر:** خشتیسوور.

**آجِر:** کرێکار.

**إجْرَاء:** بەجێهێنان، ئەنجامدان.و. رایکردن.

**إجْرَام:** تاوانکردن.و. کەوتنەتاوانەوە.

**أجْفَال:** رەوینەوە.

**أجَل:** ئاکام، دەرئەنجام.و. سەرەمەرگ.و. ماوە؛ کاتی خۆی.و. بەڵێ.

**آجِل:** داهاتوو.

**إجلاء:** چۆلکردن.و. کشانەوە.

**أُجُم:** قەلا.و. کۆشك.

**إجْمَاع:** کۆمەڵبەستن، ئاپۆڕ.

و۔ کۆڕا.

**إجمال:** تێکڕا، گشتی.و۔ بەکورتی.

**أَجَمَة:** بێشەڵان؛ دارستانی جەنگڵ.و۔ لانکۆ؛ لانەی شێر.

**آجِن:** سێناو؛ ئاوی لێڵ و بۆگەن.

**أَجْنَبِيّ:** بێگانە، بیانی.

**إجْهَاش:** قولپەی گریان.

**إجْهاض:** لەباربردن.

**أَجْهَر:** رۆژکوێر.

**أَجْهِزَة:** ئامێر،ئامراز.و۔ دەزگا

**أَجْوَف:** پووچ، کلۆر.

**أَجِيج:** بڵێسە؛ کڵپەی ئاگر.

**أَجِير:** کرێگرتە، کرێکار.

**آح:** سپێنەی هێلکە.

**إحَاطَة:** دەورگرتن، داگرتن.و۔ پەی پێبردن.

**إحَالَة:** هەواڵەکردن، گوێزانەوە.و۔ گێڕان.

**إحْباط:** تێکشکان.و۔ داڕوخان.و۔ هەڵەکردن.

**إحْتِبَاس:** گیران؛ چوونە گرتووخانەوە.و۔ وەستاندن.

**إحْتِجَاج:** گەلەکۆمەکی.و۔ نارەزایی، بێزاری.و۔ بەڵگەهێنانەوە.

**إحْتِرَاز:** خۆپاراستن، پارێزگاری.

**إحْتِرَاف:** پیشەوانی، بوون

بەخاوەن پیشە.

**إخْتِرَاق:** سوتاندن.

**إخْتِرَام:** ڕێزگرتن.

**إخْتِشَاد:** کۆبوونەوە، خڕکردنەوە.

**إخْتِضَار:** گیاندان، سەرەمەرگ.

**إخْتِفَال:** ئاهەنگ گێڕان، کۆمەڵبەستن.

**إخْتِقَار:** بەسووك تەماشا کردن.

**إخْتِقَان:** خوێن تیازان.

**إخْتِكَار:** قۆرخکردن؛شتومەك شاردنەوە بۆگرانی.

**إخْتِكَاك:** لێك خشان.و.

سوان.

**إخْتِلَال:** داگیرکردن، زەوت کردن.

**إخْتِلَام:** خەوبینین؛ گان کردن لە خەودا.

**إخْتِمَال:** دەشێ، دەگونجێ. و. توانین.و. ئارام گرتن.

**إخْتِوَاء:** داگرتن، لەخۆگرتن.

**إخْتِيَاج:** نەبوونی، دەستکورتی.و. پێویستی.

**إخْتِيَاط:** یەدەك، سپێر، نوستوو.

**إخْجَاف:** زۆرداری، ستەم.و. لایەنگیری.

**أُخْجِيَّة:** مەتەڵ.

**أَحَد:** تاك، تەنها .و. يەك .و. يەك شەممە.

**إحْدَاث:** داهێنان .و. هەراش. و. بەرپابوون.

**أَحْدَب:** كۆم، كووڕ.

**إحْدَى عَشَر:** يازده.

**إحْرَاج:** دەغەڵی .و. کەوتنە تاوانەوە .و. بەگێرهێنان، تەنگاوکردن.

**أَحْرَش:** دەوەن، گژوگیا .و. زبر.

**أَحْرَى:** شیاوتر، باشتر.

**أَحْزَان:** ناڕەحەت کردن، بێزارکردن.

**إحْسَاء:** دەرخواردان.

**إحْسَاس:** هەستکردن، زانین.

**إحْسَان:** خێرو چاکەکردن، بەخشین.

**أَحْشَاء:** هەناو، گیپاڵ.

**إحْصَاء:** ئامار، ئەژمار .و. سەرژمێری.

**إحْصَان:** قایم کردن .و. پارێزکاری.

**إحْضَار:** ئامادەکردن، سازدان .و. هێنان، هاوردن.

**أَحْقَاب:** ساڵانی درێژ.

**إحْكَام:** قایم کردن، پتەوکردن.

**إحْمَاء:** گەرم کردن .و. داخستن .و. پاراستن.

**أحمَر:** سوور.

**إحمِرَار:** سووربوونه‌وه، سوور هه‌لگه‌ڕان.

**أحمَق:** گێل، گه‌وج.

**إحنَة:** قین، رق.

**أحوَب:** تاوانبار.

**أحوَل:** خێل، چاو ئه‌م پاوپا.

**أحوَى:** ره‌ش، سیا.

**أحيَاء:** زیندووکردنه‌وه، بوژانه‌وه .و. زینده‌وه‌رزانی.

**أحيَاناً:** جاروبار، جاربه‌جار.

**أخ الزوج:** شوبرا، هێوه‌ر.

**أخ:** برا .و. براده‌ر، هاوڕێ.

**إخافَة:** ترساندن.

**إخبَاء:** دامرکان.

**أخبَار:** هه‌واڵ، ده‌نگوباس .و. ئاگادارکردن، پێ‌ڕاگه‌یاندن.

**أخت الزوج:** دش.

**أخت:** خوشك، واهه‌ر، باجی.

**إختِبَاء:** خۆشاردنه‌وه.

**إختِبَار:** تاقیکردنه‌وه.

**إختِتَام:** ته‌واوبوون .و. کۆتایی پێ‌هێنان.

**إختِرَاع:** داهێنان، هه‌ڵبه‌ستن.

**إختِزَال:** هه‌ڵپاچین، کورتکردنه‌وه.

**إختِصَار:** کورتکردنه‌وه.

**إختِصَاص:** پسپۆڕی، کارامه‌یی، شاره‌زایی.

**إختِطَاف:** فڕاندن.

**إختِفَاء:** خۆشاردنەوە.

**إختِلاج:** هەڵتەکان؛ لێدانو پەرینی دەمار.

**إختِلاس:** دزین.

**إختِلاط:** تێکەڵاوی.و. تێکچران.

**إختِلاف:** ناکۆکی، جیاوازی.

**إختِلال:** تێکچوون.و. پشێوی، شپرزەیی.

**إختِناق:** خنکان.

**إختِيَار:** هەڵبژاردن، بەگەنکردن.

**أخدود:** کەندڕ.و. چاڵ، کەندەك.

**أخذ وعطاء:** ئاڵوگۆڕ.

**أخْذ:** وەرگرتن، سەندن.و. بەدەست هێنان.و. گرتنەبەر.و. پەیوەست بوون.

**آخَر:** ئیکە، جگەلەو، ئیتر.

**آخِر:** دوامەمین، پاشین.و. دوایی، ئیتر.و. پەڕ، ئەوسەر.و. بن، ژێر.

**إخْرَاج:** دەرهێنان.و. دەرکردن، قاودان.

**آخِرَة:** کۆتایی، دوایی.و. رۆژیدوایی.

**أخْرَس:** لاڵ، بێزمان.

**أُخْرَى:** ئیدی، ئیتر.

**إخْصَاء:** خەساندن.

**أخْصائيّ:** پسپۆڕ، کارامە،

شارەزا.

**إخْصَاب:** پیتاندن.و. پیتێن، بەفەڕ.

**إخْضَاع:** رام کردن، سەرپێ شۆڕکردن.

**إخْطَاء:** هەڵەکردن.و. تاوانکردن.

**أُخْطُبوط:** هەشت پێ(نا).و. جلە؛ لە چیرۆکو داستانی کۆندا.

**إخْفَاء:** شاردنەوە، حەشاردان

**إخْفَاق:** تێکشکان، نشستی .و. کەوتن.

**إخْلاص:** دڵپاکی، کارڕاستی.و. دڵسۆزی، چگەرسۆزی.

**أخْلاق:** رەوشت، ئاکار.

**إخْمَاد:** دامرکاندن،کوژانەوە.

**أخْمَص:** پاژنە؛ چاڵایی بەری پێ.

**أخْن:** منگن.

**إخْوَة:** برایان.

**أُخُوَّة:** برایەتی.

**أَخَوِيّ:** برایانە.

**أخْيَار:** چاکەکاران.و. هەڵبژێراوان.

**أخِيذ:** گیراو، بەند.

**أخِير:** کۆتا، پاشینە.و. کۆتا، دواهەمین.

**أَدَاء:** بەجێهێنان،

جێبەجێکردن.

**أَدَاة**: کەرەستە، پێویستی.و. ئامێر، ئامراز.

**إِدَارَة**: کارگێڕی، هەڵسوڕاندن .و. دەوردان.

**إِدَام**: کەوچك، پێخۆر.و. ڕۆن ، چەوری.

**إِدَامَة**: درێژەپێدان، لەسەر ڕۆیشتن.

**أَدَب**: وێژە.و. ڕەوشت.و. تەمێ، پەروەردەکردن.و. ئابڕوو.

**أَدَبِيّ**: ڕەوشتی.و. وێژەیی.

**إِدْخَال**: تێخستن، ئاخنین.

**إِدِّخَار**: هەڵگرتن، پاشەکەوت کردن.

**إِدِّعَاء**: بانگەشەکردن.و. داخوازی.

**إِدْرَاك**: پەیپێبردن، زانین.و. پێگەیشتن.

**إِدْغَام**: تێهەڵکێشان.

**أَدْكَن**: ڕەنگ تاریك.

**إِدْلَاء**: شۆڕکردنەوە.و. گوتن. و. بەڵگەهێناوە.

**آدَم**: ئادەم؛ باوکی مرۆڤایەتی

**إِدْمَان**: لەسەرڕۆیشتن.

**أَدْنَى**: ئەوپەڕ.و. نزیکتر.

**إِدْهَاش**: سەرسام کردن.

**أُدُور**: قۆڕ، گونك(ن).

**أَدِيب**: وێژەر،وێژەوان، بوێژ.

**أدِيم:** پێست، کەوڵ.و. ڕوو.

**إذْ:** کە.و. لەپڕ، لەناکاو.و. لەوددەمەدا.

**إذا:** ئەگەر.

**إذاً:** کەواتە، جا، دەسا.

**إذابَة:** تواندنەوە.

**إذاعَة:** پەخش‌وبڵاوکردنەوە.

**أذان:** بانگدان.

**إذْعَان:** کوێڕایەڵی، ملکەچی.

**إذْن:** ڕێدان، ماوەدان.

**أُذُن:** گوێ.و. دەسك، قوڵف.

**إذْهَاب:** خستنەڕێ، ڕەتکردن.

**أذى:** زیان، ئازار.و. خراپە.

**أذِيَّة:** ئازار، ئێش.و. سزا، ئەشکەنجە.

**أراجِف:** درۆو دەلەسە.

**إرَاحَة:** ئاسوودەکردن، حەسانەوە.

**إرَادَة:** خواست، ویست.و. ورە، تین.

**إرَاقَة:** ڕژتن.و. پیاکردن، پرژان.

**أرَب:** ئامانج، مەبەست.و. پێویستی.و. تێگەیشتن.

**إرْب:** ئەندام؛ پارچەی لەش.

**أُرْبَة:** گرێ.و. بۆینباخ.

**أرْبِطَة:** بەستەر.

**أرْبِعاء:** چوارشەممە.

**أرْبَعَة:** چوار.

**أرْبَعِين:** چل.

**أرْبَعِينِيَّة:** چله.

**إرْتِبَاط:** پەیوەندی.و. هەڵواسین.

**إرْتِبَاك:** چەواشە.و. شڵەژاوی، پشێوی.

**إرْتِجَاج:** لەرزین، جوڵان.و. تێکەڵوپێکەڵکردن.و. پشێوی

**إرْتِجَال:** سەرپێیی، بێبیرکردنەوە.

**إرْتِخَاء:** خاوبوونەوە، سست بوونەوە.

**إرْتِدَاء:** پۆشین، لەبەرکردن.

**إرْتِدَاد:** گەڕانەوە، پاشگەز بوونەوە.و. هەڵگەڕانەوە، لادان لەدین.

**إرْتِضَاء:** پەسەندکردن.و. قایل بوون.

**إرْتِعَاد:** راتەکاندن.

**إرْتِعَاش:** راچڵەکین، لەرزین.

**إرْتِفَاع:** بەرزی، بڵندی.

**إرْتِقَاء:** بەرزبوونەوە، سەرکەوتن.

**إرْتِكَاب:** ئەنجامدان، کردن.و. سواربوون.

**إرْتِكَاز:** راگیربوون، چەقین.و. پشت پێبەستن.

**إرْتِهَاب:** زراوچوون، تۆقین.

**إرْتِيَاح:** شادبوون، پێخۆش بوون.

**إرْث:** جێماوە، پاشماوە.

**أرْثة:** چاوگ، سوتەمەنی.

**إرْجَاع:** گەڕانەوە، دانەوە.

**أُرْجُوحَة:** جۆلانە، دیلانە.

**أرْجُون:** ئەرخەوان؛ دارێکە گوڵی سوور دەگرێت.

**إرْحَال:** رەوانەکردن، ناردن.

**إرْسَال:** ناردن، رەوانەکردن.

**إرْشاد:** رێنیشاندان، رابەری کردن.

**أرْض:** زەوی، خاك.

**إرْضَاع:** شیردان.

**أرْضَة:** مۆرانە، خۆرە (ج).

**أرْضِيَّة:** جێپێ، شوێن پێ.و. زەویيانە، ئەرزانە.

**إرْغَام:** رەنجاندن،دڵشکاندن.

**أُرْغُون:** ئورگون؛ ئالەتێکی مۆسیقىيە.

**أَرَق:** خەونزڕان، بێخەوی.

**أرْمَة:** دروشم، ئاڵا.

**أرْمَلَة:** بێوەژن.

**أرْكَب:** کەروێشك(ئا).

**إرْهَاب:** ترساندن، تۆقاندن. و. توندوتیژی.

**إرْهَابِيّ:** ترسێنەر.و. توند.

**إرْهَاق:** شەکەت بوون، ماندووبوون.و. ماندووکردن.

**إرْوَاء:** ئاودێری، داشتن.و. پاراوکردن.

**أُرُومَة:** کۆتەرەدار، بنکەدار.

وـ بنج، ريشه.وـ بن، بێخ.

**أرويّة:** بزنەکێوی(ئا).

**أريب:** کارامە، کارزان.وـ

هەژار، دەستکورت.وـ

فێلباز.وـ ژیر، بەهۆش.

**أريج:** بۆنی خۆش.

**أريض:** سەوزەلان.

**أريكَة:** قەنەفە.

**إزَاء:** بەرامبەر، هەمبەر.

**إزاحَة:** لادان.وـ کورتکردنەوە.

**إزار:** پۆشتە، بالاپۆش.

**أزار:** دەرپێ.وـ پەشمە،

جاجم.

**أزارَة:** یارمەتیدان، هاوکاری.

**إزالَة:** لابردن، نەهێشتن.وـ

سڕینەوە.وـ دوورخستنەوە.

**أزب:** بنە، بالاکورت.

**أزدِحام:** ئاپۆرە، جەنجاڵ،

کەڵەکەبوون.

**إزدِراد:** گاڵتەپێکردن،

ریسواکردن.

**أزدِهار:** گەشەکردن.

**إزدِواج:** تێکەڵاوبوون،

ئاوێتەبوون.

**إزدِياد:** پەرەسەندن،

پتربوون.

**أزر:** هێز، توانا.وـ پشت.

**أزرَق:** شین.

**أزَة:** گرمەی هەور.

**إزعَاج:** هەراسان کردن،

جاڕس کردن.و. سەخڵەت بوون، وەڕس بوون.

**آزِفَة:** خەریکە؛ نزیك بۆتەوەو کاتیهاتووە.و. ڕۆژی دوایی.

**أزَل:** نەمر، هەمیشە.

**أزَلِيّ:** هەمیشەیی، نەمری.

**أزْمَة:** تەنگوچەڵەمە، تەنگش .و. تەنگانە، دژواری.

**أزْهَر:** ڕوون، ڕووناك.و. بریقەدار.و. مانگ.و. ڕووخۆش.

**أزيب:** نابەجێ.و. کورتەبنە .و. چوست، چالاك.

**أزِيز:** ناڵە، گیزە.و. قوڵپە؛ کوڵانو هاتنەجۆش.

**أُس:** توان، جار.و. بنەما، بناغە.

**آس:** مۆرد؛ درەختێکە گەڵایەکی بۆن خۆشیهەیە.

**إساءَة:** خراپەکردن،بەدکاری.

**إسار:** کۆت، قۆڵبەست.

**أسَاس:** بنەڕەت، ڕەچەڵەك.و. بناخە، بنچینە.

**أساسِيّ:** بنەڕەتی.و. سەرەکی.

**أُسَامَة:** شێرکۆ(نا).

**إسبانخ:** سپیناخ(ڕ).

**إسْبِداج:** سپیاو.

**أُسْبُوع:** هەفتە، حەفتە.

**إسْت:** کۆم، قنگ.و. بناغە.

**إسْتِئْناف**: دەست پێکردنەوە ،تێهەڵچوونەوە ، هەڵکردنەوە .

**أُستاذ** : مامۆستا، سەیدا.

**إسْتِتباب**: جێگیربوون، دامەزراندن.

**اسْتِثْمار**: بەبەرهەم هێنان.و. سوودوەرگرتن.و. سەرمایە دەست خستن.

**إسْتِثْناء**: کەلاخستن، هەڵاوێژتن.

**إسْتِثْنائِيّ**: هەڵاواردن.

**إسْتِجابَة**: پێوتن.و. بەقسەکردن، بەگوێکردن.

**إسْتِجْواب**: لێپرسین، پێدرکاندن.

**إسْتِحْسان**: بەچاك زانین، پەسەندکردن.

**إسْتِحْقاق**: رەوابوون.و. پێویست کردن.و. جێبەجێکردن.

**إسْتِحْياء**: شەرم کردن.و. لەڕوودامان.

**إسْتِخْبارَات**: هەوالگری.

**إسْتِخْدَام**: بەکاربردن، بەکارهێنان.

**إسْتِخْرَاج**: دەرهێنان.

**إسْتِخْلاص**: رزگارکردن.و. پوختەکردن.

**إسْتِدَارَة**: پێچکردنەوە ،

بادانەوە.

**إستِدرَاك:** پێزانین.و.
پڕکردنەوە.

**إستِدعَاء:** سکاڵانامە.و.
ویستن، خواستن.

**إستِدلال:** بەلگەهێنانەوە.و.
ڕێبەدیکردن.

**إستِراحَة:** پشوودان،
حەسانەوە.

**إستِراد:** هاوردەکردن.

**إستِرجاع:** گەڕانەوە،
وەرچەرخان.

**إستِرداد:** دانەوە، گێڕانەوە.

**إستِسلام:** خۆبەدەستەوەدان
.و. ڕزگاربکردن.

**إستِشارَة:** ڕاوێژپێکردن.و.
پرس پێکردن.

**إستِشهَاد:** گیان بەختکردن؛
لەڕێی خوادا بوون بەقوربانی.
و. بەلگەهێنانەوە.

**إستِصواب:** پەسەندکردن.

**إستِطَاعة:** لەبارەبوون،
پێکران.و. توانایی.

**إستِطَان:** نیشتەجێکردن.

**إستِطلاع:** ئاگایی، هۆشیاری
.و. لێکۆلینەوە، تێڕوانین.و.
زانین.

**إستِعَاب:** لەخۆگرتن،
داگرتن.و. گرتن.و.
گونجاندن.

**إستِعَارَة:** خوازه، خواستن.

**إستِعاضَة:** خستنه‌ڕێ.

**إستِعَانَة:** پشت پێبه‌ستن.

**إستِعجال:** په‌له‌کردن، خێراکردن.

**إستِعدَاد:** ئاماده‌یی، سازیی .و- خواست، حه‌ز.

**إستِعراض:** نواندن، نمایش کردن.و- خۆپیشاندن.

**إستِعطاء:** ده‌روه‌زه‌کردن، سوالکردن.

**إستِعلامات:** پرسگه.

**إستِعمار:** ئاوه‌دانکردنه‌وه.و- داگیرکردن.

**إستِغرَاب:** سه‌راسیمه، واق‌وڕمان.

**إستِغرَاق:** داگرتن، گشتگیری .و- خایاندن، پێچوون.

**إستِغفار:** گه‌ڕانه‌وه، په‌شیمان بوونه‌وه.

**إستِغلال:** قۆرخ کردن، قۆستنه‌وه.

**إستِفَاء:** وه‌رگرتن.و- کۆکردنه‌وه.

**إستِفادَة:** که‌ڵك وه‌رگرتن، قازانج کردن.

**إستفاض:** بلاوبوونه‌وه.و- فراوان بوون.

**إستِفتاء:** راوه‌رگرتن.

**إستِفتاح:** ده‌ست پێکردن.و-

یەکەم فرۆشتن(سفتاح).

**إستِفرَاغ:** رشانەوە.و. ئێق، ئێلنج دانەوە.

**إستِفسار:** لێپرسین.

**إستِفهام:** پرس.و. پرسیارکردن.

**إستِقَاظ:** بێداربوونەوە.

**إستِقالَة:** وازهێنان؛ دەست لەکار هەلگرتن.

**إستِقامَة:** سەقامگیری، راستەرێی.و. پایەداری.

**إستِقبال:** بەرەوپیرچوون، پێشوازی.و. ئایندەیی، داهاتوویی.

**إستِقرَاء:** لێکۆلینەوە، توێژینەوە.و. لێگەران.و. لەبەرگرتنەوە.

**إستِقرَار:** پشوودان،حەوانەوە .و. سرەوتن ، ئۆقرەگرتن.و. جێگیربوون، چەسپان.

**إستِقطاب:** جەمسەرگرتن.

**إستِقلال:** سەربەستی، سەربەخۆیی.

**استِکَانة:** ریسواکردن، زەلیل کردن.

**إستِکبار:** خۆبەگەورەزانین.

**إستِکتاب:** پێنووسین.و. پێوتنەوە.

**إستِلام:** وەرگرتن.

**إستِماع:** گوێگرتن، ژنەوتن.

**إستِمالَة:** دلْدانەوە.

**إستِمْدَاد:** درێژەپێدان.و. کۆمەکیکردن.

**إستِمْرَار:** بەردەوامی، لەسەررۆیشتن.

**إستِمْناء:** دەسپەڕکردن، ناوهێنانەوە.

**إستِناد:** پشت بەستن، پشتگیری.و. پاڵدانەوە.

**إستِنْباط:** هەڵێنجان، هەڵگۆزین.

**إستِنْتاج:** دەرئەنجام.و. بەرهەم هێنان.

**إستِنْساخ:** لەبەرگرتنەوە، ڕوونووس کردن.

**إستِنْشاق:** هەڵلوشین، هەڵمژین.

**إستِنْکار:** پێناخۆش بوون.و. لالوتی، ملنەدان.

**إستِهْدَاف:** مشت لێگرتن، نیشانەلێنانەوە.

**إستِهْزَاء:** گاڵتەپێکردن.

**إستِهْلاك:** پوان، بەکاربردن.

**إستِهلال:** سەرەتا،پێشگفتار.و. دەست پێکردن.

**إستِهْوَاء:** سەرگەردان کردن، سەرلێشێواندن.

**إستِوَاء:** ناوەڕاست.و. کوڵان، هاتنەجۆش.

**إستِيلاء:** زەوتکردن، دەست

بەسەراگرتن.

**إسْحاق:** وردوخاش کردن.

**أسَد:** شێر(ئا).و- ئازا.

**آسِر:** دڵفڕێن.و- دڵگیر.

**أسْر:** گرتن، بەندکردن.و- هەموو، گشت.و- میزگیران(ن)

**إسْرَاف:** دەستبڵاوی.و- زیادەڕەوی.

**أُسْرَة:** خێزان، بنەماڵە.و- خزم، کەسوکار.

**أسْرَى:** شەوڕەوی.

**أُسْطُوانة:** لولەك.و- قەوان؛ شتێکی خەپلەییە گۆرانی لەسەرتۆمار دەکرێ.و- کۆڵەکە.

**أُسْطُورَة:** ئەفسانە، داستان.

**أُسْطُول:** کەلەکەشتی.

**إسْعاف:** فریاکەوتن، هانا، پێڕاگەیشتن.

**آسِف:** بەداخ، بەکەسەر.

**أسَف:** مەخابن، کەسەر، هەژمەت.

**أسْفَل:** ژێرو، خوارو.

**إسْفنج:** ئەسفنج.

**إسْقاط:** خستن.

**إسْكات:** مات کردن.و- بێدەنگ کردن.

**إسْكافِيّ:** پینەچی، پینەدۆر.

**إسْكان:** نیشتەجێکردن.

**إسْلام:** خۆبەدەستەوەدان،

ملکەچی.و. ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

**أسَلَة:** چقڵ، درك.و. سەری زمان.

**أسْلُوب:** شێواز، شێوە.و. جۆر، چەشن.

**إسْم:** ناو.

**أسْمَر:** گەنم رەنگ، بۆر.

**إسْمِنْت:** چیمەنتۆ.

**آسن:** سیاناو؛ بۆگەناوی ئاو.

**إسْناد:** دانەپاڵ.و. پشتگیری.

**إسْهال:** سکچوون(ن).

**أسْوَة:** نموونە، پێشەنگ.

**أسْوَد:** رەش، سیا.

**آسِي:** تیمارکەر.

**أسَى:** پەژارە، کەسەر.

**أسِيْر:** بەندکراو، گیراو، یەخسیر.

**أسِيْل:** لووس، ساف.و. نەرمونۆڵ.

**إشَارَة:** هێما، نیشانە.و. نیشان؛ هێمایەکە دادەنرێ بۆ رێنموونی.

**إشَاعَة:** دمگۆ؛ ئەوقسەیەی ئەم دەمو ئەودەم دەکات.

**إشْتِباك:** تێکبەربوون، ئاڵۆزان، تێکچڕان.

**إشْتِباه:** دوودڵی،گومان بردن.

**إشْتِرَاك:** هاوبەشی،

بەشداربوون.

**إشتِقاق:** لەت بوون، کەرتو پارچە بوون.و. داتاشران.

**إشتِهاء:** ئارەزو،حەزلێکردن.

**إشتِهار:** ناودەرکردن، ناوپەیداکردن.

**إشتِیاق:** ئامەزرۆ، ئارەزومەندی.

**إشرَاف:** سەرپەرشتی، چاودێری.

**إشرَاق:** درەوشانەوە، روونالا کردنەوە.

**إشعَال:** داگیرسان، هەڵکردن.

**إشغَال:** خەریك بوون.

**إشکَال:** دوودڵی؛ لێڵی‌و نا روونی شتێك.

**إشمِئزَاز:** قێز، بێزکردنەوە.و. هەرەسان، جاڕس بوون.

**أشمَط:** تێکەڵاو.و. ماشوبرنجی.

**أشنان:** ئەسپوون؛ بنکە گیایەکە بۆ شت شۆرین بەکاردێت.

**أشنَة:** قەوزە(ر).

**إصَابَة:** تووش بوون، دووچار بوون.و. بەرکەوتن، پێکان.

**أصالَة:** رەسەنی.و. راستو بەجێی.

**أصبُع:** پەنجە، قامك.

**إصدَار:** ناردن.و. دەرکردن.

**إصْر**: پەیمان.

**إصْرار**: پێداگرتن،
لەسەرڕۆیشتن.

**آصِرَة**: پەیوەندی.

**اصْطَبْل**: تەویلە، گەوڕ؛
شوێنی حەوانەوەو ئالیکدانی
ئاژەڵە.

**إصْطِفاف**: ریزبوون

**إصْطِناعِيّ**: دەستکرد.

**إصْطِياد**: راوکردن.

**إصْغاء**: گوێگرتن، ژنەوتن.

**أصْل**: بناغە، بنچینە.و-
رەگو ریشە.و- سەرچاوە.و-
رەگەز، رەچەڵەك.و- هۆ،
مەبەست.

**أصْلاً**: لەڕاستیدا.و- هەرگیز.

**إصْلاح**: چاکسازی،
چاکەخوازی.و- گونجاندن.

**أصْلَع**: بێموو، رووتاوە.

**أصْلِيّ**: سەرەکی، سەرەتایی
.و- بنچینەیی.و- نەژاد،
رەسەن.و- راستەقینە.

**أصَمّ**: کەڕ، بێگوێ.

**أُصُول**: دەستوور، باو، یاساو
ڕێسا.و- بناغە، سەرچاوە.

**أصِيص**: ئینجانە.و- شکاو.

**أصِيل**: رەسەن، جسن.و-
دەمەوئێوارە.

**إضاءَة**: رووناك کردنەوە.

**إضاعَة**: بەبادادان،

بەفیڕۆدان.

**إضافَة:** میوانداری.و. وێڕا، سەرەڕا.و. پترکردن، خستنەسەر.

**إضافي:** سەربار،خستنەسەر .و. زیادە.

**إضبارَة:** پاژۆ، دۆسیە؛ ئەو پێچکەیەیە کە کاروبارو رازو نیازەکان لەخۆدەگرێ.

**أضحُوكَة:** قەشمەرجاڕ.

**أُضحِيَّة:** قوربانی.

**إضراب:** مانگرتن؛ دەست لەکارهەلگرتن.

**إضطِجاع:** پالّدانەوە.

**إضطِراب:** پەشێوی، شپرزەیی.و. نیگەران، پەشۆکان.

**إضطِرَار:** ناچاری.و. دەستکورتی.و. پەنا بۆبردن.

**إضطِهاد:** چەوسانەوە.

**أضعاف:** چەندجارە.

**إضمار:** شاردنەوە، حەشاردان.

**إضمِحْلال:** پەککەوتن.و. تەفروتونابوون.

**إطاحَة:** رۆشتاندن، رەتکردن .و. لەناوبردن.

**إطار:** چێوە، چەمەرە.

**إطاعَة:** گوێرایەڵی، فەرمانبەری.

**إطالَة:** درێژەپێدان.و-
درێژکردنەوە.
**إطْباق:** پێکەوەنان.
**إطْراء:** پیاهەڵدان.و-
پێناسەکردن.
**أطْرَش:** کەڕ.
**أطْرُوحَة:** زانستوتار،
توێژینەوەی زانستی.و-
پرسیار.
**إطْرِيَة:** مەڕشتە؛ نانی وردی
سوورەوەکراو.
**إطّلاع:** پێزانین.و-
سەیرکردن، تێڕوانین.و-
چاودێریکردن.
**إطْعام:** دەرخواردان.و-
خواردن پێدان.
**إطْفاء:** کوژانەوە،خەفەکردن.
**إطْلاع:** پێزانین، ئاگاداربوون
.و- شارەزایی، ئاشنایی.
**إطْلاق:** تەقاندن.و- وازلێهێنان
، لێگەڕان.و- بەرەڵاکردن. .و-
کشتاندن.و- کشتگیری.
**أطْلَس:** نەخشەنامە،
ئەتڵەس، نەخشەی
جگرافی.و- دێز.و- جل شڕ.
**إطْمِئْنان:** ئارامی،
ئاسوودەیی.و- دڵنیایی.
**أطِمَّة:** ئاگردان، ئاورگ.
**إطْناب:** درێژکردنەوە،
درێژدادڕی.و- لاف لێدان.

**إظهار:** ئاشكراكردن، دەرخستن.و. پیشاندان.و. بلاوكردنەوە.

**إعادة:** گێڕانەوە، دووبارەكردنەوە.

**إعاشة:** ژیاندن، بەخێوكردن.

**إعاقة:** دواخستن، تەگەرەتێخستن.

**إعانة:** یارمەتیدان، كۆمەكی كردن.

**إعتبار:** رەچاوكردن.و. بایەخ، رێز.

**إعتباط:** هەڕەمەكی، كوێرانە.

**إعتباطي:** هەڕەمەكی، بەرێكەوت.

**إعتداء:** دەستدرێژی، شەڕفرۆشتن.و. پەلاماردان.

**إعتدال:** مامناوەندی، میانەیی.و. فێنكی.و. راستی، رێكی.

**إعتذار:** پۆزشت، پاكانە كردن.

**إعتراض:** رەخنەگرتن.و. بەهانەهێنانەوە.

**إعتراف:** دان پیانان، پێ‌لێنان.

**إعتراك:** بەرەنگاری.

**إعتزاز:** شانازیكردن.و. بەرێزبوون.

**إعتِصَار:** دەرهێنان.و. گوشین

**إعتِصَام:** پەناگرتن،
پەنابردنەبەر.

**إعتِقاد:** باوەڕکردن.و.
بیروباوەڕ.

**إعتِقال:** گرتن، گیران.

**إعتِکاف:** خەریك بوون،
سەرقاڵ بوون.و. گۆشەگیری،
خۆجیاکردنەوە.

**إعتِلال:** نەخۆشی،دەردەدار.

**إعتِماد:** رابینین، متمانە.

**إعتِناء:** خەمخۆری،پەرۆشی.

**إعتِناف:** ناڕاستەوخۆ.

**إعتِیاد:** راهاتن، هۆگربوون.

**إعتِیادِيّ:** ئاسایی، باویی.

**إعْجَاب:** بەدڵاچوون، بەدڵ
بوون.

**إعْداد:** ئامادەکردن،
سازکردن.

**إعْدَام:** لەسێدارەدان.و.
نەهێشتن.

**إعْراب:** دەرخستن.و.
شیکردنەوە؛ سەر وژێر بۆ
دانان.

**إعْرَاض:** خۆپاراستن،
دورەپەرێزی.

**أعْراض:** نیشانە؛
دەرخستنی هۆی شتێ.

**أعْزَب:** رەبەن، سەڵت.

**إعْشاب:** گژوگیا.

**إعْصار:** گەردەلول؛ گێژەڵۆکەو باوبۆران.

**إعْفاء:** لێبوردن، لێخۆش بوون.و. وازلێهێنان، لێگەڕان.

**إعْلام:** ڕاگەیاندن.و. هەواڵ، دەنگوباس.

**إعْلان:** ڕاگەیاندن.و. بڵاوکردنەوە، جاڕدان.و. ئاشکراکردن.

**إعْمار:** ئاوەدانی.

**أعْمَى:** کوێر، نابینا.

**أعْوَان:** داروودەستە، دەستو پێوەند.

**أعْوَج:** چەوت، گێڕ، لار.

**إعْوَر:** یەك چاو.و. تاقانە.و. ڕێی‌نەهات.و. خراپ، قەڵب.

**إعْياء:** شەکەت بوون، ماندوو بوون.

**أعْيان:** پیاوماقوڵان، پیران.

**إغاثَة:** فریاکەوتن، هانا.و. پشتوانی‌کردن.و. ڕزگارکردن.

**إغارَة:** بەسەرداداان، کردنەسەر.

**إغاظَة:** ڕق هەڵساندن، تورەکردن.

**إغْتِباط:** شادیی، خۆشی.

**إغْتِصاب:** زەوتکردن، داگیرکردن.

**إغْتِيال:** ڕەشەکوژی.

**إغْرَاء:** فریودان، تەفرەدان.

**إغرَاق:** خنكاندن، نقوم كردن.و- پێوەنان، پێلێداگرتن.

**أغَرّ:** قەش؛ ئەوەیە بەشێکی مووی سپی بووبێت.و- خۆشخو.و- سپی.

**إغضاء:** لێبوردن.و- چاوپۆشی.

**إغضاب:** تورەکردن، ورووژاندن.

**إغفال:** خەڵەفاندن، فریودان.و- پشت گوێخستن.

**إغلاق:** داخستن، پێوەدان.

**أغلَب:** زۆرجار، زۆربەی.

**أغلَبِيَّة:** زۆرینە، زۆربەی.

**إغماء:** تاسان، بێهۆش بوون.

**إغماض:** چاوپۆشین، چاونوقاندن.

**أغنِيَة:** گۆرانی.

**أُف:** ئۆف، ئاخ؛ داخ هەڵکێشان.

**إفادَة:** سوود لێوەرگرتن.و- دەرخستن، هەڵڕشتن.

**إفاقَة:** بێداربوونەوە، بەئاگاهاتنەوە.

**آفَة:** کۆسپ، لەمپەڕ.و- بەلا، دەرد.

**إفتِتاح:** کردنەوە، والاکردن.

**إفتِخار:** شانازی، نازین.

**إفتَراء:** تومانج، قۆڕن؛ قسه بەدەمەوه کردن.

**إفتِراس:** تێك شکاندن.و. نێچیرکوشتن.

**إفتِراض:** وادانان، گریمان.و. پێویستکردن.

**إفتِراق:** جیابوونەوه، دابڕان.

**إفتِعال:** هەڵچوون.

**إفتِقاد:** ونکردن.

**إفتِقار:** هەژاربوون، نەداربوون.و. پێویست بوون.

**إفتِكاك:** لێکبوونەوه، هەڵوەشانەوه.

**أفراخ:** هەڵهێنان.

**إفراز:** دەردان.و. جیاکردنەوه.

**إفراط:** پێوەنان.و. زیادەڕەوی.

**إفزاع:** ترساندن، تۆقاندن.

**إفساد:** گەندەڵکردن، خراپ کردن.و. رزاندن.

**إفشاء:** ئاشکراکردن، درکاندن.

**إفضاء:** تێگەیاندن.و. راشکاوانه.و. واگەیاندن.

**أفضَلِيَّة:** چاکێتی، پێش خستن.

**إفطار:** بەربانگ کردنەوه، رۆژوشکاندن.

**أفعَى:** مەژدیها، شامار(ج).

**أفّاك:** درۆزن.

**أُفق:** ئاسۆ، سۆما، سوێگە .و.
لا، لێوار.

**إفك:** درۆ، تومانج.

**آفِل:** ئاوا.

**إفلاس:** نابوت بوون، مایە
پووچ بوون.

**إفلِيج:** گۆج.

**أفُول:** ئاوابوون.

**أفيُون:** تلیاك، بافوور؛
گژوگیایەکی سڕکەرە.

**إقامَة:** راوەستان، راگرتن.و.
هێشتنەوە.و. نیشتەجێبوون

**إقبال:** پێشوازیلێکردن،
بەرەوپووچوون.

**إقتِباس:** لێوەرگرتن،
لێفێربوون.

**إقتِحام:** تێخزان.

**إقتِداء:** پەیرەویکردن،
شوێن کوتن.

**إقتِدار:** توانین، پێکران.

**إقتِراب:** لێك نزیکبوونەوە،
تخوون کەوتن.

**إقتِراح:** پێشنیار.

**إقتِران:** جووت بوون.

**إقتِصاد:** ئابووری.و.
زۆرکردن.

**إقتِضاء:** ویستن، خوازتن.

**أقحُوان:** چاوەپشیلە(ر).

**إقدام:** پێ‌هەلگرتن.و.

لەسەررۆیشتن.و.
دەستپێشخەری.

**إقرار:** درکاندن، پێلێنان،
دان پیانان.

**أقرَع:** کەچەڵ.

**أقصَی:** ئەوپەڕ، ئەوسەر.و.
دوورترین.

**أقِط:** کەشك؛ خواردنێکە
لەدۆ دروست دەکرێ.

**إقطاعِيّ:** دەرەبەگی.

**إقفال:** کلۆمدان، داخستن.

**إقلال:** کەمکردنەوە.و.
گوێزانەوە.

**إقلِیم:** هەرێم، ناوچە.

**أقلِیَّة:** کەمایەتی.

**إقناع:** رازیکردن، قایل
کردن.

**إکاف:** کورتان، کۆپان.

**إکتِراء:** بەکرێگرتن.

**إکتِراث:** گوێدان.و.
بەدەمەوەهاتن،
بەدەنگەوەهاتن.

**إکتِساب:** وەدەست خستن،
وەدەست هێنان.و.
پەیداکردن، دەستکەوتن.

**إکتِساح:** راماڵین، راپێچان.

**إکتِشاف:** دۆزینەوە.و.
پێگەیشتن.

**إکتِفاء:** بەس بوون.و.
تێربوون.

**اكثريّة:** زۆربە، زۆرینە.

**إكراء:** بەکرێدان.

**إكرام:** رێزلێنان، رێزلێگرتن.

**إكراميّة:** رێزانە.و. دەستخۆشیانە، پاداشت.

**إكراه:** ناچاری، نابەدڵ.و. زۆرلێکردن، تەنگاوکردن.

**أكزيما:** بیرۆ(ن).

**إكساء:** پۆشتەکردن، داپۆشین.

**أكسدة:** ژەنگ هەڵهێنان.

**آكِل:** خۆرا.

**أكل:** خواردن، خۆراك.

**إكمال:** تەواوکردن.و. نیوەچڵی.

**أكمام:** قۆزاخەی گوڵ.

**أكمة:** گرد، تەپۆلکە.

**أكيد:** بێگومان، سوور، دڵنیا.و. قایم، پتەو.

**آل:** کەسوکار، خزموخوێش.و. زانیاری.و. تراویکە.

**ألا:** مۆ؛ بۆ ئاگادارکردنەوە.و. دەنا، ئەگینا.

**إلاّ:** جگە، بەدەر.

**الاّ:** جگە، بێجگە.و. دەی، ئادەی.

**إلب:** قولانج.و. کۆبوونەوە.

**ألبان:** شیرەمەنی.و. سپیایی.

**ألبسة:** پۆشاك، جلو بەرگ.

**ألبوم:** وێنەدان.

**آلَة:** ئامێر، ئامراز.و. ئەندام.
و. تفاق.

**إلْتِئام:** سارێژبوون.و.
کۆبوونەوە.و. پێوەلکاندن.

**إلْتِباس:** تێکەڵبوون.و.
سەرلێتێکچوون.

**إلْتِحاق:** پێگەیشتن.و.
لکاندن.و. خۆدانەپاڵ.

**إلْتِزام:** پەیوەست، پابەند.و.
بەرپرسیاری.و. دەست
بەسەراگرتن.و. ناچاری.

**إلْتِصاق:** چەسپان،
پێوەنوسان.

**إلْتِفات:** لاکردنەوە،
ئاوەڕدانەوە.و. ئاگاداری،
چاودێری.و. وریایی،
بەئاگابوون.

**إلْتِفاف:** تێك ئالآن.

**إلْتِقاء:** پێك گەیشتن.

**إلْتِقاط:** دۆزینەوە.و.
چنینەوە، هەڵگرتنەوە.

**إلْتِماس:** تکاکردن، خوازتن
.و. داواکردن.

**إلْتِهاب:** سوتانەوە،
چوزانەوە.و. گڕگرتن،
بڵێسەدان.

**إلْتِواء:** تێك پچڕان،
تێك ئالآن.

**إلْحاح:** پێداگرتن،
لەسەرڕۆیشتن.

**إلْحاد**: گومڕایی، بێبڕوایی.

**إلْزام**: پەیوەستکردن.و۔ چەسپاندن.

**إلْغاء**: پووچکردنەوە، هەڵوەشاندنەوە.

**ألْف**: هەزار.

**أُلْفَة**: هۆگری.و۔ یەککگرتن.

**إلْقاء**: فرێدان، تورڕدان.و۔ دووان، ئاخاوتن.

**ألَم**: ئازار، ئێش.

**إلْمام**: ئاشنایی، شارەزایی .و۔ چورتم، بەلا.

**ألْمَع**: زیرەك، ژیر.

**إلْهاب**: داگیرسان، گڕگرتن.

**إلْهام**: سروش؛ خورپەی دڵ.

**أُلُوف**: خۆشەویست.و۔ راهاتوو.

**أُلُوف**: هەزاران.

**أُلُومِنْيُوم**: فافۆن، ئەلمنیۆم

**أُلُوهِيَّة**: خوایەتی.

**إلى**: تا، تاکو.و۔ بۆ.

**إلْيَة**: دووگ.

**ألِيف**: ماڵی، رام.و۔ هاوڕێ، هاودەم.و۔ یەکبوون.

**ألِيم**: بەسوێ، بەئێش.

**ألْيَوم**: ئەمڕۆ.

**آلِيّ**: خۆکار، ئامێرکار.

**أمْ**: یا، یان، یاخود.

**إمَاتَة**: مراندن، لەناوبردن.

**إمارَة**: میرنشین.و۔ ناوچە،

هەرێم.

**أمارَة:** نیشانە.و. راز، وشەی نهێنی.

**إماطَة:** داماڵین.و. دەرخستن.

**إمالَة:** لارکردنەوە.

**أمام:** پێش، بەردەم.و. بەرامبەر.

**إمام:** پێشەوا.و. نوێژخوێن.

**إمامَة:** پێشەوایی.و. پێشنوێژی.

**أمان:** ئارامی، ئاسوودەیی.و. حەوانەوە.و. بێوەیی.و. راستی.

**أمانَة:** ئەسپەردە.و. سەرڕاستی، راستگۆیی.و. دڵنیایی.و. دڵسۆزی، خۆشەویستی.

**إمْبَراطُور:** شاهەنشا، میری‌میران.

**إمْتِثال:** گوێرایەڵی، فەرمانبەری.

**إمْتِحان:** تاقیکردنەوە.

**إمْتِداد:** درێژبوون.و. کۆمەکی‌کردن، دەست بۆدرێژ کردن.

**إمْتِصاص:** مژین.

**أمْتِعَة:** کەلوپەل، شمەك.

**إمْتِلاك:** دارایی، هەبوویی.

**إمْتِناع:** لادان.و. نەهێشتن.و. خۆلاپاراستن.

**إمْتِنان:** سوپاس کردن، پێزانین.و. ماڵئاوایی.

**إمْتِياز:** جیابوونەوە.و. نایاب.و. جودایی.

**إمْحاء:** رەش کردنەوە، سڕینەوە.

**أمَد:** دەم، سات.

**أمْر:** فەرمان، کار.و. هێز، دەسەلات.و. مەبەست.

**آمِر:** فەرماندە، فەرماندەر.و. تێخوڕ.

**إمْرَار:** تێپەڕاندن، بەسەربردن.

**أمْرَد:** کۆسە؛ لووسکەی بێ تووک.

**أمْس الاول:** پێرێ.

**أمْس:** دوێنێ.

**إمْساك:** خۆگرتن.و. گرفت؛ خواردن لە گەدە گیربوون(ن).و. رژدی.و. گرتن.

**أمْسِيَّة:** ئێوارە؛ دەمەو خۆر ئاوابوون.و. شەو.

**إمْضاء:** بەجێهێنان.و. واژۆ، ئیمزا؛ مۆرکردنی تایبەتی.

**أمْعاء:** ریخۆڵە.

**إمْعان:** لەسەرڕۆیشتن.و. سەرنجدان، وردبوونەوە.

**إمْكان:** گونجان، دەستدان.و. توانا.

**أمَل:** هیوا، ئاوات.و.

مەبەست، خواست.

**إملاء:** پڕکردنەوە.و.
ڕێنووس.

**إملاق:** هەژاری، نەداری.

**أُمّ اربعةواربعين:** هەزارپێ(ج)

**أُمّ الزوج:** خەسوو.

**أُمّ:** دایك.و. سەرچاوە،
بنەڕەت.و. زۆربەی.

**إمّا:** یا، یان؛ ئەم یا ئەو.

**أمّا:** یان، یاخود.و. بەلام.و.
تەنانەت.

**أمَة:** کەنیزەك.

**أُمّة:** نەتەوە، گەل.و. نەوە،
وەچە.و. ئاین.

**أُمّيّ:** دایکانە.و.
نەخوێندەواری.

**أمْن:** ئاسایش.و. ئاشتی،
دڵنیایی.و. بێوەیی.

**آمِن:** بێترس.و. ئاسوودە
.و. دڵنیا.

**أمَنَة:** باوەڕپێکراو.

**أُمْنِيَّة:** هیوا، ئاوات.و. بەتەما

**أُمومة:** دایکێتی.

**أمير:** شازادە، فەرمانڕەوا.و.
ڕاوێژکار.

**أمين:** دڵنیا، بێترس.و.
دڵسۆز.و. باوەڕپێکراو،
ئەسپەردیار.و. سەرڕاست،
دەستپاك.

**إنْ:** ئەگەر، ئەگینا.

**أنا:** من، خۆم.

**إناء:** دەفر، ئامان، قاپ.

**إنابَة:** پەشیمان بوونەوە، باشگەزبوونەوە.و. کردنەنوێنەر.

**إناخَة:** یەخدان.

**إنارَة:** چراخان، رووناک کردنەوە.

**اُناس:** خەڵك.

**إناطَة:** پێوەکردن.

**أناقَة:** کەشخەیی، قۆزی.و. رێکوپێکی.

**أنام:** دروستکراو.و. خەڵك، مەردوم.

**أنانيّ:** خۆویست.

**أنبار:** کۆگا، عەمبار.

**إنبِساط:** شادی، دڵخۆشی .و. راخستن.و. کشان.و. درێژکردنەوە.

**إنبِطاح:** راکشان، بەپشتاکەوتن.

**إنبِعاث:** دەرپەرین، هاتنەدەر.و. پاڵنان.و. تەقینەوە.

**أنتِ:** تۆ؛ بۆ مێینە.

**أنتَ:** تۆ؛ بۆ نێرینە.

**إنتاج:** بەرهەم هێنان.

**إنتِباه:** هاتنەوەسەرخۆ، بەئاگاهاتن.و. سەرنج، ئاگا.

**إنتِحار:** خۆکوشتن.

**إنتِخاب:** هەڵبژاردن.و. بەگەنکردن، دەست نیشان کردن.

**إنتِداب:** کردن بەنوێنەر.و. ژێردەستی.و. چاودێری.و. ناردن، رەوانەکردن.

**إنتِساب:** لایەنگیری، ئارەزوگیری.

**إنتِشار:** بلاوبوونەوە، پەرەسەندن.

**إنتِصاب:** رەپکردن، قیتکردنەوە.و. دامەزران، دانان.

**إنتِظار:** چاوەڕوانی.

**إنتِعاش:** ژیانەوە، بوژانەوە.

**إنتِفاخ:** ئاوسان، هەوکردن.و. ئەستوربوون، قەڵەوبوون.

**إنتِفاضَة:** راپەڕین،راچەڵەکین.و. راوەشان.

**إنتِفاع:** قازانج کردن.

**إنتِقاد:** رەخنەگرتن، لێدوان و. کاشوەرگرتن.

**إنتِقال:** گوێزانەوە.

**إنتِقام:** تۆڵەسەندنەوە، سزادان.

**إنتِکاس:** نووچ کردن.و. گەڕانەوە بۆ دۆخی جاران.

**أنتُم:** ئێوە؛ بۆ نێرینە.

**إنتِماء:** گەشەکردن.و. لایەنگیری، ئارەزوگەری.

**أنتُنَّ:** ئێوە؛ بۆ مێینە.

**إنتِهاء:** كۆتایی، پایان.و- برانەوە.

**إنتِهاز:** هەل قۆستنەوە، دەست خستن.

**إنتِهازيّ:** هەلپەرست.

**إنتِهاك:** ئابڕووبردن، ریسوا كردن.و- سنوورشكاندن.

**أُنثى:** مێ، مێچكە.

**إنجاب:** نەوەخستنەوە، مندالّبوون.

**إنجاز:** ئەنجامدان،رایی‌كردن.

**أنجانَة:** مەركانە، سوێنە.

**أنجَر:** لەنگەر؛ ئاسنێكی قورسە دەخرێتە ئاوەوەبۆ وەستانی كەشتی.

**إنجِلاء:** دووركەوتنەوە.و- روون بوونەوە.

**إنجيل:** مژدە؛ ئینجیلی حەزرەتی عیسا.

**انجار:** پاوان.

**إنحِدار:** لێژبوونەوە.و- كەوتنەخوارەوە.

**إنحِراف:** لادان.و- لاربوونەوە.

**إنحِطاط:** داكەوتن، داڕوخان.

**إنحِلال:** هەلّوەشاندنەوە.و- داهێزان، داوەشان.و- چارەسەركردن.

**إنحِياز:** چوونەپالّ، لایەنگرتن.

**إنخِفاض:** نەوین، دابەزین.

**إندِثار:** لەنارچوون.و- سڕینەوە.

**إنبِحَار:** تێکشکان، بەزین.

**إندِلاع:** هەڵگیرسان.

**إندِماج:** تێوەچوون.و- تێکەڵاوبوون.

**إندِمال:** سارێژبوون.

**إنزال:**دابەزاندن، هێنانەخوار.

**إنزِلاق:** هەڵخلیسکان، ترازان، خزان.

**إنزواء:** گۆشەگیری.

**إنس:** مرۆڤ، مەردوم.

**إنسان:** مرۆڤ، مەردوم.و- پیاو ، زەلام.

**آنِسَة:** دادە، خوشکە.

**إنسِجام:** گونجان، رێکەوتن.

**إنسِحاب:** کشانەوە، پاشەکشە.

**إنسِحاق:** پلیشانەوە.و- وردبوون، هاڕان.

**إنسِدَاد:** بەستران، داخران.

**أنسِيّ:** ماڵی.و- مرۆڤ.

**إنشاء:** دروستکردن.و- دامەزراندن.و- دەست پێکردن .و- پێك هێنان.و- داڕشتن.

**إنشِرَاح:** دڵکرانەوە، پێخۆش بوون.

**إنشِقَاق:** هەرەس بردن.و- قڵیشان، درزبردن.و- لەتو

بەت بوون.

**أنشُودَة:** سروود.

**إنصات:** گوێگرتن.و. بێدەنگ بوون.

**أنصار:** پشتیوانان.و. دەستوپێوەند.

**أنصِباب:** چۆڕانەوە، داڕژان.

**إنصِراف:** وازلێهێنان، لێگەڕان.و. دوورکەوتنەوە.

**إنصِرام:** پێبەڕاندن، کوزەراندن.و. پچڕان.

**إنضِباط:** ڕێکوپێك بوون.و. دابین کردن

**إنضِمام:** سەریەك خستن، گردکردنەوە.

**إنطِباع:** تۆماربوون، چاپ بوون.و. جێگیربوون.و. وێناکردن.

**إنطِلاق:** دەرپەڕین، دەرچوون.و. بەرەلابوون.

**إنطِواء:** نوشتانەوە.و. هەڵپێچان.و. گۆشەگیری.

**إنعاش:** ژیانەوە، بوژانەوە.

**إنعِزال:** گۆشەگیری.

**إنعِكاس:** هەلگەڕانەوە.و. پێچەوانەیی.و. دانەوە، پەرچدانەوە.

**أنف:** لووت، کەپو.

**آنِفاً:** پێشو.

**إنفاق:** بژێوی، خەرجی.

**أنَفَة:** سەربەرزی، شکۆیی.و- فیز، نازین.

**إنفِتَاح:** والآبوون، کرانەوە.

**إنفِجَار:** تەقین.و- تەقەمەنی.

**إنفِرَاد:** تەنیایی.و- جودایی.

**إنفِصَال:** دابڕان، لێکبوونەوە

**إنفِصالِيّ:** جیاخواز، جیاویست، جیاگەری.

**إنفِصام:** درزبردن، تلّیشان.و- ترازان.

**إنفِضَاع:** فلیقانەوە.

**إنفِطَار:** درزبردن، قلّیشان.و- لەت بوون.

**إنفِعَال:** کاردانەوە.و- بەرپەچدانەوە.

**إنفِکَاك:** هەلّوەشان، جیابوونەوە.و- لێکترازان، لەجێچوون.

**إنفلاق:** لەت بوون، کەرت بوون.و- گزنگدان، ڕۆژبوونەوە.

**إنقَاذ:** رزگارکردن، دەربازکردن.

**إنقِرَاض:** قڕتێکەوتن، تەفرو تونابوون.

**إنقِسَام:** دابەش بوون.و- ناکۆکی.

**إنقِضَاء:** بەسەرچوون، نەمان .و- ڕۆیشتن.

**إنقِطَاع:** بڕان، بچڕان.و-

دابڕان.

**إنقِلاب:** هەڵگەڕانەوە.و.
سەرەوژێربوون.

**إنقِلاع:** هەڵکەندن، لەڕیشەوە
دەرهێنان.

**إنقِيَاد:** ملکەچی، گوێڕایەڵی.

**إنكَاء:** کولانەوە.

**إنكَار:** ملەجوڕێ.و.
ملنەدان.

**إنكِسَار:** شکان.و. شکست،
بەزین.و. لەت بوون.

**إنكِشَاف:** ئاشکرابوون،
دەرکەوتن.

**إنكِماش:** چوونەوەیەك،
خۆخواردنەوە.و. گرژبوون.

**أنمُلَة:** سەرەپەنجە.

**أنمُوذَج:** نموونە، وێنە.

**إنّا:** ئێمە.

**إنّما:** بەڵام؛ بۆچەسپاندنو
گومان تێدا نەهێشتنیشتێك.

**أنّى:** کەی.و. چۆن.و. لەکوێ.

**إنهَاء:** کۆتای پێهێنان،
بڕانەوە.

**إنهَاض:** راپەڕاندن.و.
هەستاندن.

**إنهِزَام:** شکست خواردن،
بەزین.و. تێکشکان.

**إنهِماك:** سەرقاڵ، خەریك.

**إنهِيار:** هەرەس هێنان،
روخان.

**أنواع:** جۆراوجۆر، هەمەچەشن.

**أُنوثة:** مێیەتی.

**آنِي:** هەنوکەیی،دەمودەست.

**أنِيس:** هۆگر.و. رووخۆش.

**أنِيق:** کەشخە، چەلەنگ.

**أنِين:** نووزە، نرکەو نالە.

**آه:** وای، ئای! ئاخ هەڵکێشان.

**إهَاب:** پێستەی خۆش نەکراو.

**إهَاجَة:** چوزانەوە.

**أهَالِيّ:** هاولاتیان، دانیشتوان

**إهَانَة:** سووک کردن، ریسوا کردن.و. تانەلێدان.

**أُهْبَة:** ئامادەباشی.و. خۆسازکردن.و. کەرەستە، پێویستی.

**إهْتِزاز:** لەرینەوە، هەژان.

**إهْتِمَام:** گوێدان، پەرۆشی، دەربەست بوون.و. بایەخ پێدان.

**إهْدَاء:** پێشکەش کردن، بەخشین.و. رابەریکردن.

**أهْدَاب:** برژانگ.

**أهْل:** خێزان، هاوسەر.و. شایەن،شایستە.و. کەسوکار.و. شارەزا، لێهاتوو.

**إهْلال:** داوەراندن.

**أهلاًوسهلاً:** بەخێربێن،

حۆش هاتن.

**أهلِيّ:** مالّی، دەستەمۆ.و.

خۆماڵّی؛ شتی تایبەت.و.

شاریی.

**أهلِيَّة:** شایستەیی.و.

لێهاتوویی.و. توانست.

**إهْمَال:** فەرامۆش کردن،

پشتگوێخستن.

**أهمِيَّة:** گرنگی، بایەخی.

**أوْ:** یا، یاخود.و. تا.

**أوَان:** سات، کات.و. هەڕەت،

دەم.

**أوبَة:** گەڕانەوە، هاتنەوە.

**أُوتُوماتِيك:** خۆبزوێن.و.

لەخۆوە، خۆکارە.

**أوْج:** لوتکە، پۆپە.و. بەرزی.

**أوْحَد:** تاقانە، یەکانە.و.

بێوێنە.

**إوَزّ:** مراوی(با).

**أوْسَط:** میانە، ناوەند.و.

راست.و. ناوەنجی.

**أوسْطَى:** وەستا.

**أوْعِيَّة:** لوولەك.

**أوْفَى:** بەوەفا، ئەمەکدار.و.

بەئەنجام گەیاندن.

**أوقِيانُس:** زەریا.

**أولَئِك:** ئەوانە.

**أولُو:** خاوەن.

**أوْلَى:** لەپێشتر، باشتر.و.

سەرەتایی.

**أوَلِيَّة:** پێشەکی، سەرەتایی.
و۔ بەڵگەنەویست.

**أوْن:** وەرز، دەم.و۔ نەرم و
نیانی.

**أوَّل:** یەکەم.و۔ سەرەتا.و۔
هەرەت، دەم.

**أوَّلِيّ:** سەرەتایی.و۔ سەرەکی
، یەکەمی.

**إي:** ئەرێ، بەڵێ.

**أي:** واتە.

**إياب:** گەڕانەوە

**آيَة:** نیشانە، هێما.و۔ بەڵگە.
و۔ دەرناسا؛ شتێ لەرادە
بەدەر بێت.و۔ ئایەتی قورئان
.و۔ ئامۆژگاری، پەند.

**إيْثَار:** پەسەندکردن.و۔
خۆنەویستن.

**إيجاب:** پێویست.و۔
ناچارکردن، زۆرلێکردن.و۔
بوون.

**إيجابِيّ:** بەجێی، بەباش.و۔
ناچاری.

**إيْجَاد:** پەیداکردن، هێنانەدی
.و۔ دۆزینەوە.

**إيْجاد:** دۆزینەوە.

**إيْجَار:** بەکرێدان.

**إيْجاز:** کورتە، بەکورتی.

**إيْحاء:** پێڕاگەیاندن.و۔
سروشتکاری.

**إيْدَاع:** سپاردن.و۔ دانان،

نەسپەردە.

**إيرَاث:** چاوگ، سوتەمەنی.

**إيراد:** هێنان.و. دەستکەوت، داهات.

**آيس:** نائومێد.

**أيْسَر:** چەپە.و. ئاسان.و. چەپلەر.

**إيْصَال:** گەیاندن، گواستنەوە .و. گەیشتن.

**أيْضاً:** دیسان، هەروەها.و. دووبارە، جارێکیتر.

**إيْضَاح:** روونکردنەوە.و. لێکدانەوە، راڤەکردن.و. ئاشکراکردن.

**إيْمَاز:** تێخوڕین، فەرکار.

**إيْفَاء:** سەرڕاستی، بەلێنپارێزی.

**إيْقَاد:** هەلگیرساندن، ئاگرکردنەوە.

**إيْقَاع:** کەوتن.و. رێکیدەنگو ئاواز.

**إيْقَاف:** وەستاندن، راگرتن. و. پەك خستن، دواخستن.

**إيقان:** لێکۆڵینەوە.و. دڵنیابوون.و. جەخت کردنەوە.

**أيْقُونَة:** وێنە، روو.

**أيْكَة:** دەوەن.

**إيْلاج:** پیاکردن، تێخستن.و. چوونەناو.

**إيلاف:** پەیمان، مەرج.

**أيْلُول:** رەزبەر؛ مانگێکی

ساڵە.

**إيماء:** ئاماژەکردن.

**إيمَان:** بڕوا، باوەڕ.

**أيْنَ:** کوا، لەکوێ.

**أيْنَما:** لەهەرکوێ.

**إيهام:** فریودان،

بەهەڵەدابردن، لەخشتەبردن.

**إيْوَاء:** داڵدەدان.و. پاراستن.

**أيْوَان:** هەیوان.

**أيّ:** کام.و. هەرچی، هەر.

**أيّار:** جۆزەردان.

**أيّان:** کەی.

**أيِّم:** بێوەپیاو.و. بێوەژن.

ب

**ب:** پیتیدووەمە لەزمانی عەرەبیی‌دا.و. بە، لە.و. هەر.و. تەنها.و. بەخوا.

**بُؤبُؤَ:** بیلبیله، گلێنه.

**بِئر:** بیر، چاڵاو.

**بُؤرَة:** تیشکۆ؛ چاڵی‌ئاگردان.و. بنکه، سەرچاوه.

**بِئس:** خراپ، درێو.

**باء:** گەڕایەوه.

**بائِد:** دوابڕاو.و. لەناوبەر.

**بائِر:** خراپ، بێ‌کەڵك.و. لەناوچوو.

**بائِس:** هەژار، گەدا.و. بێزار، شپرزه.

**بائِض:** هێلکەکەر.

**بائِع:** فرۆشیار.

**بائِن:** دیار، ئاشکرا، روون.

**باب:** دەرگا، دەروازه.و. پلەوپایه.و. بەش.

**بابا:** باوکه.و. پاپا؛ سەرگەورەی ئاینیگاورەکان.

**بابُوج:** پاپووج، سۆڵ.

**بابونج:** بیبوونه،
چاوەپشیلە(ر).

**باتِر:** برەر.

**باجَة:** سەروپێ.

**باجِر:** ورگن.

**باحِث:** توێژەر، لێکۆڵەر.و.
پشکنیار.

**باحُور:** چلەی هاوین.

**باخِرَة:** پاپۆڕ.

**بادِر:** دەستوبرد، پەلەکردن
.و. دەست پێشخەر.

**بادِیء:** دەست پێشخەر،
زوودەست، نوێکار.

**بادِیَة:** سارا، ئاران، چۆڵەوانی
.و. لادێی.

**باذَق:** باسوق.

**باذِنجَان:** باینجان، رەشە(ر).

**بار:** باڕ، مەیخانە.

**بارِحَة:** دوێنێ.

**بارِد:** سارد.و. سست، خاو.و.
لەسەرخۆ.

**بارّ:** گوێڕایەڵ.و. پیاوچاك.

**بارِز:** دیار، زەق،دەرکەوتوو.

**بارِع:** شارەزا، لێزان.

**بارَك الله:** ئافەرین، خوابە
پیتو فەڕیکات.

**بارُود:** بارووت؛ دەرمانی
تەقەمەنی.

**بارُومتر:** پەستان پێو.

**بارِي:** خواوەند.و. دروستکار،

